# خۆڕاگری

## لە کاتی فیتنە و ئاشووبەکاندا

چەسپاوبوون لەسەر دینی پەروەردگاری زەوی و ئاسمانەکان

نوسەر : کلاشن یمني

وەرگێران : دامەزراوەی انفال





انفال
ANFAL

# خۆڕاگری له كاتی فیتنه وئاشووبه‌كاندا

## چه‌سپاوبوون له‌سه‌ر دینی په‌روه‌ردگاری زه‌وی و ئاسمانه‌كان

سوپاس و ستایش بۆ الله ی خاوه‌ن ده‌سه‌ڵات وه‌ خاوه‌ن هێز و توانا سه‌رخه‌ری ئیماندارانی خۆڕاگر، وه‌ ڕیسواكه‌ری كافرانی سته‌مكار، وه‌ درووود و سه‌لام له‌سه‌ر چاكترینی دروستكراوان وه‌ له‌سه‌ر ئه‌وه‌ی جیهادی به‌ شمشێر و زمان كرد، ئه‌مانه‌ته‌كه‌ی گه‌یاند وسه‌رخه‌ری ئوممه‌ت پێغه‌مبه‌رمان محمد علیه الله الصلاة والسلام

له‌پاشاندا...

بێگومان ناز ونیعمه‌تی هیدایه‌ت نهێنی به‌خته‌وه‌ریه‌ له‌ دونیا و دواڕۆژدا وخاوه‌نه‌كه‌ی دڵ و ده‌روونی ئاسوده‌یه ،ئه‌گه‌ر تووشی خۆشی بوو شوكرانه‌ بژێره‌ وه‌ ئه‌گه‌ر له‌ ناخۆشیه‌كی هاته‌ ڕێ ئارامگره‌، هه‌رده‌م له‌سه‌ر خێر وچاكه‌یه‌ له‌ هه‌موو حاڵ و ساتێكیدا ،وه‌ ئه‌وه‌ی ئه‌م نیعمه‌ته‌ی له‌ده‌ست دا هیچ نرخێكی نیه‌، وه‌ زۆر سه‌یره‌ بۆ كه‌سێك هیوای وابێت سه‌ركه‌وێ وسه‌رفراز بێت، كه‌چی هیچ هۆكارێك ناگرێته‌ به‌ر بۆئه‌وه‌.

وه‌ بۆ ئێمه‌ له‌ سه‌له‌فی صالحانمان له‌ هاوه‌ڵان و تابعین، هه‌یه‌ له‌وانه‌ی كه‌ ڕێ ی هیدایه‌ت وخۆڕاگری گرته‌ به‌ر بوو به‌ چاكترین پێشه‌وا له‌ پابه‌ندبوون به‌ هۆكاره‌كانی سه‌ركه‌وتن و سه‌رفرازی له‌ دونیاو دوا ڕۆژدا.

وه‌ ئه‌وان خاوه‌ن هه‌ڵوێست بوون له‌ خۆڕاگری له‌سه‌ر حه‌ق وڕاستی، وه‌ ڕێگای حه‌ق وڕاستی به‌ستراوه‌ته‌وه‌ به‌ هه‌ژان و ناخۆشی و به‌ڵا وموصیبه‌ته‌كان،وه‌له‌ چیرۆكه‌كانی خۆڕاگری وئارامگری له‌سه‌ر ناخۆشیه‌كانی ڕێگای حه‌ق، چیرۆكی هاوڵی به‌ڕێز:

### "ئه‌بوو عه‌قیل عبدالرحمن ی كوڕی عبدالله-یه"

ئه‌بوو عه‌قیل عبدالرحمن ی كوڕی عبدالله به‌له‌وی ئه‌نصاری ئه‌وسی ناسراو به‌ ئه‌بوو عه‌قیل یه‌كه‌م كه‌س بوو كه‌ بریندار بوو له‌ ڕۆژی یه‌مامه‌دا ، كاتێك كه‌ به‌ تیرێك پێكرا، كه‌ به‌ نێوان شان و دڵییه‌وه‌ كه‌وت، تیره‌كه‌ی ده‌ركرد ، وه‌ڵای

چەپی بەتەواوی لاواز وبێ هێز بوو، پاشان بردرا بۆ سەربازگەی موسوڵمانان ، وە کاتێك شەڕەکە گەرم بوو، و موسوڵمانان پاشەکشەیان کرد بۆ سەنگەرەکانیان و سەربازگەکانیان ،ئەو کاتەی ئەبوو عەقیل لاواز وبێ هێز ببوو بەهۆی برینەکەیەوە، گوێی لە (مەعنی کوڕی عەدی) بوو هاواری دەکرد ئەی ئەنصارییەکان ، الله الله نۆرەی دوژمنانتانە وە مەعن چووە پێشەوە بۆ شەڕ .

ئەبوو عەقیل هەڵسا بۆ لای قەومەکەی ، وە چەند موسوڵمان پێیان وت: ئەی ئەبوو عەقیل تۆ نابێت بڕۆیت بۆ شەڕ، ئەویش لە وەڵامدا وتی: بانگێك درا ناوی منی هێنا، ئەوانیش لە وەڵامیاندا وتیان بانگی تۆ نەکراوە بەڵکو بانگەکە دەڵێت ئەی ئەنصارەکان، مەبەستیان بریندااران نیە، لێرەدا ئەبوو عەقیل وتی: ئێ منیش لە ئەنصارم، وە منیش وەڵامی بانگەوازەکە دەدەمەوە ئەگەر بە گاگۆڵکێش بێت. خۆی ئامادەکرد و بەدەستی ڕاستی شمشێرەکەی گرتە دەست پاشان هاواری کرد : ئەی ئەنصارەکان پەلامار وهێرش بردنێکی ترە وەکو ڕۆژی حونەین.

هەموویان کۆبونەوە، بە وورەو ڕۆحێکی بەرزەوە داوای شەهیدبوون یان سەرکەوتنیان دەکرد، هەتا دوژمنەکەیان تێك شکاند، وە لەم هێرشەدا قۆڵی ئەبوو عەقیل لە شانیەوە بڕدرابوو، وە چواردە برینی لی کەوتەوە هەر هەمووی بەرەو مەرگی دەبرد .

وە ئیبنو عومەر بەلای ئەبوو عەقیل دا تێپەڕی کەلەسەرە مەرگ و کۆتایی ژیانی دابوو پێی ووت: ئەی ئەبوو عەقیل، ئەویش بە زمانێکی قورسەوە وەڵامی دایەوە وپێی ووت بفەرموو؛ وە پاشان وتی : دۆڕان بۆ کێ بوو؟ لەوەڵامی دا ئیبنو عومەر پێ وت موژدە بێ لێت ، دوژمنی الله کوژرا، کە گوێ ی لە ئیبنو عومەر بوو ئەبو عەقیل پەنجەی بەرزکردەوە بۆ ئاسمان و وتی الحمد لله.

ئیبنو عومەر لە باسکردنیا وتی: بەردەوام ئاواتە خواز بوو وداوای شەهادەتی دەکرد، وە لە چاکترینی هاوەڵانی پێغەمبەری الله بوو ﷺ .

یا الله!! ببینن ئەم هەڵوێست و دیمەنە چەندە سەخت و قورسە، لەکاتێکدا هێرش وپەلامار بۆ سەر موسوڵمانانە، و ئەبو عەقیلیش بریندارە بە برینێکی قورس کە

پێی لاواز وبێ هێز بوو، سەرەڕای ئەوەش کە گوێی لە بانگدێری الله بوو بۆ شەڕ وجەنگ، هەڵسا و وەڵامی دایەوە، وەکوو ئەوەی هیچ برینێك و ماندوو بوونێکی تێدا نەبووبێت بەڵێ ئەمەیە چەسپاووبوون لەسەر سەختی ڕێگا وتەنیایی وناخۆشیەکەی. وە چۆن دڵێکی ئیماندار بە الله و دڵنیابوو بە پەیمانەکانی ئەترسێ یان توانا سست دەبێت؟! .

وە ئەمەشیان چیرۆکێکی ترە لە چیرۆکەکانی خۆڕاگری و چەسپاووبوون ئەویش بەسەرهاتی هاوەڵی بەرز و بەڕێز حەبیب ی کوڕی زەیدە لەگەڵ موسەیلەمەی کەزاب".

لە کۆتاییەکانی سەردەمی پێغەمبەر ﷺ دوو درۆزن پەیدابوون بانگەشەی پێغەمبەرایەتیان دەکرد یەکێکیان لە سەنعاء بوو، بەناوی ئەسوەدی کوڕی کەعبی عەنسی، و ئەوەی تر لە یەمامە پەیدا بوو کە موسەیلەمەی کەزاب بوو، ئەو دوو درۆزنە هەڵستان بە هاندانی خەڵك دژ بە ئیمانداران کە وەڵامی بانگەوازە کەی الله وپێغەمبەرەکەیان دابویەوە، وە پێغەمبەری الله ﷺ ئەوەندەی زانی پەیامێکی بۆهاتووە لە لایەن موسەیلەمەی کەزابەوە تێدا نوسراوە (لە موسەیلەمەی پێغەمبەری الله وە، بۆ پێغەمبەری الله محمد سەلامت لێ بێت )،لەپاشاندا: منیش لەم کارەی پێغەمبەرایەتی کراومەتە هاووبەش لەگەڵت، وە نیوەی زەوی بۆ ئێمەیە ونیوەکەی تر بۆ قورەیشە، بەڵام قورەیش قەومێکن دەست درێژی کارن)، پێغەمبەر الله ﷺ پەیامەکەی بۆ ناردەوە نوسراوێکی بۆ نوسی تیایدا فەرمووی:

**{بسم الله الرحمن الرحيم، من محمد رسول الله إلى مسيلمة الكذاب، السلام على من اتبع الهدى، أما بعد: فإن الأرض لله يورثها من يشاء من عباده، والعاقبة للمتقين}.**

واتە: ( بسم الله الرحمن الرحيم، لە موحەممەدی پێغەمبەری الله بۆ بۆموسەیلەمەی کەزاب ، سەلام لەوکەسەی شوێن ڕێی ڕاست کەوتووە، لەپاشاندا: بەڕاستی زەوی موڵکی الله یە و دەیسپێرێت بەهەرکەس کە بیەوێت لە بەندەکانی، سەرئەنجامیش هەر بۆ تەقوادار وپارێزکارانە.)

ئەو دۆزنە وای زانی کە پێغەمبەرایەتی موڵکێکە دەیەوێت دابەشی بکات،کاتێك کە پەیامەکەی پێ گەیشت ئەو زیاتر گومڕاتر وسەر لێشێواوتر بوو، وبەردەوام بوو لە بڵاوکردنەوەی درۆ وبوختانەکانی، بۆیە پێغەمبەری الله ﷺ نامەیەکی بۆنارد وداوای لێکرد وازبێنێ لە ڕەفتارە بێ عەقلیەکانی و لە درۆو دەلەسەکانی، بەڵام دەبێ کێ ئەو نامەیە هەڵگرێ بۆ ئەوە خۆبەزل زان وستەمکارە ، بۆیە گەنجێك هەڵبژێردرا بۆ ئەوکارە ، وەکێ بۆ ئەو کارە گرنگ وپڕ بەڵاو ناخۆشیانە دەبێت، ئەگەر گەنجان نەبن؟!

هەڵبژاردە کەوتە سەر حەبیب ی کوڕی زەید (رضي الله عنه)، کە گەنجێك بوو دڵی پڕ بوو لە ئیمان و لەوپەڕی ئامادە باشیدا بوو بۆ قوربانیدان لە پێناوی الله وپێغەمبەرەکەی، و لە پێناو سەرخستنی ئەم دینە، وەکێ بۆ ئەو ئەرك وموهیممە سەیر وگەورانەیە ئەگەر گەنجان نەبن، بەڵام لە کوێن ئەو گەنجانەی کە لەسەر (وەحی) : کتێبەکەی الله وسونەتی پەیامبەرەکەی پەروەردە بوون، وە پەروەردەبوون لەسەر ترسان لە الله تعالى ورەزامەندی ئەو؟!

شبابٌ ذلّلوا سبلَ المعالي *** و ما عرفوا سوى الإسلام دينا

تعهَّدهم فأنبتهم نباتاً *** كريمًا طابَ في الدنيا غصونا

إذا شهدوا الوغى كانوا كماةً *** يدكّونَ المعاقلَ والحصونا

وما عرفوا الأغاني مائعات *** ولكن العلا صيغت لحوناً

گەنجانێك زەلیل وملکەچی ڕێگاکانی سەربەرزی بوون ،هیچی تریان نەدەزانی جگە لەوەی ئیسلام دینە

پەیمان و وەعدیان دا، وەکو دارێك زۆر بەجوانی وبەخشندەیی پەروەردە بوون لە دوونیادا لق وپۆپیان کرد بە باشی

ئەگەر ئامادەی مەیدانی جەنگ بووان، ئەوان جەربەزە دەبوون لەقەڵاو پێگەکانیان دەدا

هیچیان نەدەزانی لە گۆرانیە بەربڵاوەکان، بەڵام شکۆمەندیان بە ئاواز دادەڕشت

حەبیب (رضي الله عنه) ڕێگەی گرتەبەر وهەستا بەم کارە مەترسیدارە وە زۆر دڵخۆش وشادمان بوو بەوەی پێغەمبەری الله ﷺ هەڵیبژاردوە بۆی، وە بەو متمانەیەی کە بەو ڕاسپێردرابوو، کاتێك حەبیب گەیشت بە موسەیلەمەی کەزاب کە پیاوەتی وعەرەبیەتی جوامێری نەدەزانی ، ئەو درۆزنە قەومەکەی کۆکردەوە دوایی ئەوەی حەبیبی کۆت وزنجیرکرد، جۆرەها ئەشکەنجەو سوکایەتیان پێ کرد، بەو کارە ئامانجیان ئەوە بوو کە هێز وتوانای نەمێنێت، وە وای لێ بکەن ئازایەتی وچاونەترسیەکەی لێ وەربگرنەوە تا لەپێش هەمووان تووشی فیتنە وبەلا ببێت ئیعلانی ئیمانی خۆی بکات بەو کەزابە، بەڵام هەرگیز ئەوەی چاوەڕوانیان دەکرد نەبوو.

لێرەدا موسەیلەمە بە حەبیبی ووت: شایەتمان دێنیت کە محمد نێردراوی الله-یە؟ حەبیبیش ووتی: بەڵێ شایەتمان دێنم کە محمد نێردراوی الله-یە،لەم کاتەدا سەرشۆڕی و ئابڕووچون ڕووی موسەیلەمەی داگیرکرد،وە دووبارە لێ پرسی: وەشایەتمان دێنی کەمن نێردراوی الله-م؟ حەبیبیش بە گاڵتەوە وەڵامی دایەوە وە ووتی: گوێم لێ نیە چی دەڵێی؟ موسەیلەمەش تورە بوو بە وەڵامەکەی حەبیب، موسەیلەمە بۆی دەرکەوت کە ئەشکەنجەدان هیچ کاری لەو گەنجە ئیماندارە نەکردوە،وە پێچەوانەوە بەڵکو ئیمانی پتەو ترو بەهێزتربووە، بۆیە موسەیلمە تورە بوو وهەڵچو وبانگی جەللادەکەی کرد کەشمشێرێکی بۆ ئامادە بکات، پاشان دەستی کرد بەپارچەکردنی لاشەی حەبیب و پارچە پارچە و بەش بەشی کرد، وە لەهەر پارچەیەك کە لە جەستەی حەبیبی دەبڕی پرسیاریشی لێ دەکرد: شایەتمان دەدەی کەمن نێردراوی الله-م؟! ،وەدووبارە وەڵامی حەبیب ئەوە بوو: کە گوێم لە هیچ نیە، وشایەتیش نادەم جگە لەوە هیچ پەرستراوێك نیە بەحەق جگە لە الله، وە محمد نێردراوی الله-یە ،ئەوانیش هەر بەردەوام بوون لە بڕینی جەستەی و پارچە پارچە کردنی، وە لە هەموو جارێکیش دووبارە ئەویش هەر بەردەوام لەوەڵامدا هەمان وەڵامی پێشوتریانی دەدایەوە، کەشایەتی دەدەم کە هیچ پەرستراوێك نیە بەحەق شایەنی پەرستن بێت جگە لە الله ، وەشایەتی دەدەم کە محمد نێردراوی

الله-یە ، لەو کارەیان بەردەوام دەبن بە پارچە پارچە کردنی جەستەی هەتا ڕۆحی لە جەستەی دەردەچێت.(رضي الله عنه)

یا الله ! ئایا ئەو نەیدەتوانی خۆی بگونجێنێت لەگەڵ موسەیلەمە !! وە وا خۆی نیشان بدات کە باوەڕی پێیەتی کە لەویش عوزری هەبوو؟

بەڵام ئەو ئیمانەی ئەم گەنجە قارەمانانەی دروست کرد، بەڕاستی جێگیر بوو لەکاتێکدا جەستەی پارچە پارچە دەکرا، و خۆی ڕاگر بوو لەکاتێك ئەوان دەیان ویست سازش بکات لەسەر دینی و بیروباوەڕەکەی، وە خۆی ڕاگرت چونکە دەیزانی کە بەهەشت بەئاسانی بە دەست نایەت کاڵایەکی گران بەهایە، جا چۆن دەکرێت داواکاری بەهەشت تەنازول بکات، وە چۆن دەکرێت داواکاری حۆریەکان تەنازول بکات ودەستبەرداریان ببێت !!!.

**ولستُ أبالي حين أقتل مسلما**
**على أي جنب في الله كان مصرعي**
**ولقد خيروني الكفر والموت دونه**
**ولقد هطلت عيناي من غير مجزع**
**وما بي حذار الموت إني لميت**
**ولكن حذاري جحم نار ملفع**

گوێ نادەم بەوەی کاتێك بە موسڵمانی دەکوژرێم
لەهەر لایەکدابێت لە پێناو الله-یە کوژرانم
بەڕاستی منیان سەرپشك کردووە بەوەی کوفر هەڵبژێم ئەگەرنا دەبێت بمرم
وە بەڕاستی منیش بەبێ ترس چاوەکانم نایە سەریەك ـکە بۆ مردن ئامادەمـ
هیچ ترس وخۆپارێزیەکم نیە لەمردن، کە من هەردەبێت بمرم
بەڵام ترس وخۆپارێزیم لە ئاگری جەهنەمە کە بڵێسەکەی سەراپا دەور دەدات

چەندین هۆکارو ڕێکاری زۆر هەن کە دات دەمەزرێنێ لەسەر چەسپاوی وئارامگری لەوانە کارێکی گرنگ ئەویش ئەومیە" گوێڕایەڵی وئیتاعەکردن وپابەندبوونە بە کۆمەڵی مسوڵمانەوە" .وەك لە موسنەدی ئەحمەد دا هاتوە :

{أن عمر بن الخطاب خطب بالجابية فقال: قام فينا رسول الله صَّلى الله عليه وسَّلم مقامي فيكم فقال: (استوصوا بأصحابي خي ار ثَّم اَّلذين يلونهم ثَّم اَّلذين يلونهم، ثَّم يفشو الكذب حتَّى إَّن الَّرجل ليبتدئ بالَّشهادة قبل أن يسألها وباليمين قبل أن يسألها فمن أراد منكم بحبوحة الجَّنة فليلزم الجماعة فإَّن الَّشيطان مع الواحد وهو من الاثنين أبعد ولا يخلوَّن كم أحد بام أرة فإَّن الَّشيطان ثالثهما ومن سَّرته حسنته وساءته سيئته فهو مؤمن }.

واتە: (عومەری کوڕی خەتاب لە (جابيه) وتاری دەدا ، فەرمووی: پێغەمبەری الله ﷺ لەناوماندا بوو لە جێگەی من وەستابوو فەرمووی: (وەسیەت تان دەکەم کە دەست بگرن بەهاوەڵەکانم لەشوێن کەوتنیان و جوێن نەدان پێیان و ئیهانەیان نەکرێ وە قەدرو ڕێزیان بگیرێ وە پاشان دەست بگرن بەتابعین کە دەکاتە ئەوانەی لەپاش هاوەڵان دێن لە منداڵەکانیان و شوێن کەوتوانیان وە پاشان دەفەرموێ وەدەست بگرن لەپاش ئەمانە بە نەوەیی سێیەم کەدەکاتە تابعی تابعین، پاشان سەردەمێك دێ کە درۆ تێیدا زۆر بڵاوە هەتا سەردەمێك دێ پیاو داوای لێنەکراوە سوێند بخوا سوێند دەخوا بەدرۆ ئەوش بەهۆی فسوق و فجوریەتی، وە کەسی واهەیە داوای شاهێدی لێنەکراوە شاهێدی دەدا بەدرۆ لەبەر فسق و فجوری، پاشان دەفەرموێ ئەوەی ناوەڕاستی بەهەشتی دەوێ با دەست بگرێ بە کۆمەڵی موسڵمانان چونکە شەیتان لەگەڵ تاکەکانە کە وەسوەسەی بۆ دروست دەکا وەدوورترە لەدوو کەس پێکەوە وە دەفەرموێ مەکەونە خەڵوەت چونکە بەتەنیا بی لەگەڵ ئافرەت سێیەمینیان شەیتانە، وە هەرکەسێك کردەوە باشەکانی دڵخۆشی کرد وتاوان وخراپەکانی دڵ تەنگی کرد، ئەوە ئەو کەسە ئیماندارە )

برایان ئەوە بزانن فەرمانی گوێڕایەڵی وئیتاعەکردن وەپابەندبون بە کۆمەڵەوە کارێکی گەورەیە ، هەرکەسێك سەرپێچی کۆمەڵی کرد ئیللا لەناوچوە وەیان بەسەر شۆڕی دەمێنێتەوە،پێغەمبەری الله ﷺ هەڕەشەی کردووە لەو کەسەی کە سەرپێچی کۆمەڵی مسوڵمانان دەکات لەزیاتر لەچەند فەرموودەیەك هاتووە،

هەروەك فەرموویەتی : **(من خرج من الطاعة وفارق الجماعة مات ميتة جاهلية) "رواه مسلم** واتە: ( هەرکەسێك دەرچوو لە گوێڕایەڵی وە جیابویەوە لە کۆمەڵ وجەماعەی مسوڵمانان کە مرد بە مردنێکی جاهیلی دەمرێت ) " موسلیم ڕوایەتی کردوە"

ئاگاداربە ئەی برام کە یەکێك بیت لەوانە نیەتت نوێ بکەرەوە ونیەتت بۆکارەکەت بێ یەکێك بە لەوانەی پشکۆیان لە مشت گرتوو مشتت توند بگرە چونکە هێشتا پشکۆکە گەرم نەبوە.

لەکۆتاییدا داواکارین لە اللە حق مان بەحەق پێ نیشان بدات و وە شوێن کەوتنی حەقیشمان پێ ببەخشێت ودوای کەوین وە بەتاڵ وناحەقیشمان بە ناحەقی پێ نیشان بدات و دوورکەوتنەوە لێی پێمان ببەخشێت ،وەخۆڕاگریەکمان پێ ببەخشێت وەك خۆڕاگری هاوەڵان (رضوان الله عليهم أجمعين ).

**بڵاوکراوەی : مؤسسة صرح الخلافة**

**نووسینی: کلاشن يمني**

**وەرگێڕان و ئامادەکردنی :دامەزراوەی انفال**

الخميس ١٧رمضان ١٤٤٢هـ

